ئەسفەهان بو. سەڵتەنەتی بەشایانی خۆی ئەزانی. پەلاماری شیرازی‌دا بـۆی نـەگیرا. دوای ئـەوە بەماوەیـەک لەنزیک هەمەدان سادق خانی شکاندو بای دایەوە بۆ سەر شیراز. دوای گەمارۆدانێکی چەنـد مانگـە شـیرازی گرت. چـاوی سـادق خـان‌و ئەبولفـەتح‌و تـاقمێ لەخزمـەکانی خـۆی دەرهێنـا. لەئەسـفەهان تـاجگوزاری کـرد (1782).

لەم قۆناغەدا گەورەترین مێملی بنەماڵەی زەند، ئاقا محەمەد خانی قاجار بو. ئاقا محەمەد کوڕی محەمـەد حەسەن خانی قاجار بو. کەسەردەمێ مێملی کەریم خان بو. ئەیویسـت بیـێ بەشـای ئێـران‌و. لـەو ململانێیـەدا کوژرابو. ئاقا محەمەد خان، بەدرێژایی ماوەی حوکمڕانی کەریم خان لەشیراز بەدەسبەسەری وەکو بارمتـە گـل درابوەوە. (مهدوی: 188) دوای مردنی کەریم خان یەکسەر لەشیرازەوە هەڵات بۆ ئەستەرئاباد. سەرانی ئێلـی قاجاری کۆکردەوەو. دەستی بەسەر ناوچەکانی سەروی ئێران‌دا گرتو. لە (1783/1197)دا ناوی لەخۆی نـا شاو. تارانی کرد بەپایتەخت.

لەسەردەمی سەڵتەنەتی عەلیموراد خان کە 3 ساڵی خایاند (1782-1785) ئاقا محەمەد زاتی نەئەکرد پەلاماری قەڵەمڕەوی زەند بدا. بەڵام کەئەم لەموچەخورتی ئەسفەهان مرد (1785/1199) و. جەعفـەر خـانی کوڕی لەجێگەی ئەو لەسەر تـەخت دانیشـت. ئاقـا محەمـەد ئیتـر کەوتـە پەلاوێشـتن جەعفـەر خـان 4 سـاڵ سەڵتەنەتی کرد. لەو 4 ساڵەدا 2 جار لەگەڵ ئاقا محەمەد بەشەڕ هاتو. هەردو جـار بەشـکاوی کشـایەوە نـاو دیواری شیراز. دیوارەکەی شیراز لەگرتن نەئەهات.

جەعفەر خان دەرمانخوارد کراو مرد(1789/1204) لوتفعەلی خانی کوڕی کەهێشـتا گـەنجێکی تـازە پێگەیشـتوبو. سەرپەرشـتی کاروبـاری بەنـدەرو کـەنارەکانی خـەلیجی ئـەکرد. دەسـبەجێ گەڕایـەوە شـیراز بکوژەکانی باوکی کوشتو. لەجێگەی ئەو دانیشت. ئاقا محەمەد چوە سەر شـیراز ئـەمجارەش بـۆی نـەگیراو گەڕایەوە تاران لەزنجیرەیەک پیلان‌و فێـڵ‌و هێـرش‌و کشـانەوەدا سـەرەنجام لوتفعـەلی شـکاو گیـراو کـوژرا. زنجیرەی بنەماڵەی زەند پێچرایەوە. بنەماڵەی قاجار کاروباری ئێرانی گرتە دەست. (مهدوی: 190).

–7–

## کۆڕینەوەی پەنابەر (1194)

محەمەد رەشید بەگی وەکیل، کەیەکێ لەگەورە دەسەڵاتدارەکانی ئەردەڵان بـو. نێـوانی لەگـەڵ خوسـرەو خان تێکچو. کەهزاد خانی کوڕی سوبحانویردی خان‌و تاقمێ لەگەورەکانی ئـەردەڵانی لەگـەڵ خـۆی بـرد بـۆ دەرباری عەلیموراد خان بۆ دەربڕینی سکاڵا لەدەس خوسرەو خان. خوسرەو لابراو، کـەهزاد خـان لەجێگـەی دانرا. گەڕانەوە سنە. خوسرەو بەمە قایل نەبو. شەوێک لەناکاو دای بەسەریان‌دا. (تحفە: 155).

بەزۆر دەری کردن‌و هەتا گوندی سورەتو لەمەحاڵی پڵنگان راوی نان. کەهزادو محەمەد رەشـید بـەگـو دەستوپێوەندەکانیان پەنایان برد بۆ مـەحمود پاشـای خالیـد پاشـای بابـان. لـەو کاتـەدا نو بـرای مـەحمود پاشایش، محەمەد پاشاو عومەر بەگ، پەنایان بـرد بـوە بـەر خوسـرەو خـان. مـەحمودو خوسـرەو پێکهـاتن سەودایەک بکەن بۆ گۆڕینەوەیان. مەحمود پاشا کەهزادو محەمەد رەشـید بنێرێتـەوە بـۆ سـنە، خوسـرەویش محەمەدو عومەر بنێرێتەوە بۆ قەڵاچوالان.

رەنگە خوسرەو خان لەم سەودایەدا، تۆڵەی شکانەکەی زرێباری لەمحەمەد پاشا کردبێتەوە، ئـەگینا ئـەم جۆرە سەودایە لەکوردەواری‌دا بەکارێکی ناشیرین دائەنرێ. مەحمود پاشا، محەمەد پاشاو عومەر بەگی کوشـت (1194 ک/ 1780ز). (تحفە: 156) (لب: 122).

رەنجوری ئەڵێ: "کوشتنی محەمەد پاشاو عومەر پاشا رەمەزانی ساڵی 1194"

## -8-

## خوسرەو خان لەشیراز

محەمەد رەشید لەڕێگە هەڵاتو روی کردە بەغداد. ماوەیەک لەبەغداد مایەوە هیچی بەهیچ نەکرد لەبەر ئەوە گەڕایەوە ئێران. چوە لای جەعفەر خانی زەند. جەعفەر خان هێزێکی گەورەی سازدا لەگەڵ محەمەد رەشید بەڕێ کەوت بۆ سەر سنە. پێشتر رەزاقولی خانی برای خوسرەو خانی هەڵگێرا بوەوەو کردبوی بەهاودەنگی خۆی. رەزاقولی دایە پاڵیان.

خوسرەو خان بەخۆیا رانەپەرمو بەرەنگارییان بکا، خاووخێزانی لەگەڵ خان ئەحمەد خانی کوڕیدا رەوانەی شارەزور کردو، خۆی چو بۆ شیراز بۆ لای عەلیموراد خان.

جەعفەر خان گەیشتە سنە. ئەمجارەیان رەزاقولی خانو محەمەد رەشید بەگ دوای راکردوەکانی ئەردەڵان کەوتن تا هەورامان. (تحفە: 157)

جەعفەر خان کەوتە زوڵمو زۆرداریو دڵی دانیشتوان، تەنانەت دڵی دەسکێشەکانی خۆیشی رەنجاند. هاوکارەکانی هەر یەکەیان هەڵاتن بۆ لایەک. رەزاقولی خان چو بۆ ورمێو، کەهزاد خانو لوتفعەلی خان بۆ کرماشان. محەمەد رەشیدیش جەعفەر خانی بەجێهێشتو چو بۆ کرماشان. لەو کاتەدا یەکێ لەوانەی بەتەمای شاهێتی بو، بەلەشکرەوە روی لەئەسفەهان کردبو. جەعفەر خان کەئەم هەواڵەی بیست سنەی بەجێ هێشتو بەپەلە بەرەو ئەسفەهان بەڕێ کەوت.

رەزاقولی خان کەزانی سنە چۆڵە لەورمێوە گەڕایەوە سنەو کاروباری گرتە دەس. پاش چەند رۆژێ کەهزادو لوتفعەلیو محەمەد رەشیدیش گەڕانەوە سنە. لەگەڵ رەزاقولیدا بو بەشەڕیان. رەزاقولی بەبرینداری هەڵات بۆ گەڕوسو دوای حەفتەیەک مرد. (تحفە: 158).

هەواڵی پەشێوانی هەلومەرجی ئەردەڵان بەعەلیموراد خان گەیشت. بۆ چارەسەرکردنی ئەو پشێوییە خوسرەو خانی بانگ کرد، سەرلەنوێ دانیایەوە بەوالیی ئەردەڵان. بەڵام خۆی لەوێ گل دایەوەو، لەباتی ئەو کاروباری ئەردەڵان سپێردرا بەخان ئەحمەد خانی کوڕی کەلەو کاتەدا لەشارەزوربو. خان ئەحمەد گەڕایەوە سنە. میرەکانی ئەردەڵان پێشوازییان لێ کردو سەریان بۆ دانەواند.

بەهۆی ئەم ئاڵوگۆڕانەوە هەندێ لەباجی ئەردەڵان دوا کەوت بو. عەلیموراد خان بۆ کۆکردنەوەی باجی کۆنەکراوە، جەعفەر خانی ناردە سنە. جەعفەر خان دیسانەوە دەستی کردەوە بەزوڵمو زۆرو ئازاردان. کەعەلیموراد بەجەورو ستەمی جەعفەرو پەرێشانی خەڵکی زانی، خوسرەو خانی رەوانەی کوردستان کردو، جەعفەر خانی کێشایەوە. دوای ئەمە بەچوار مانگ عەلیموراد خان مرد. (تحفە: 159).

## -9-

## شەڕی ئەڵلاقولی خانی زەنگەنەو خوسرەو خان

دوای مردنی کەریم خان زۆر لەو ئێلانەی کەریم خان لەکرماشانەوە گوێزابونیەوە بۆ شیرازو ئەسفەهان گەڕانەوە کرماشان، لەدەوری گەورەی زەنگەنە، ئەڵلاقولی خان، کۆبونەوە.

ئەڵلاقولی خان بەهیوای دامەزراندنی سەڵتەنەت بو. محەمەد رەشید بەگ کە لەکرماشان بو، دایە پاڵ ئەڵلاقولی خانو، هانیدا وەکو سەرەتای فراوانکردنی قەڵەمڕەوەکەی خاکی ئەردەڵان بگرێ. ئەڵلاقولی خان هێزێکی گەورەی لەئێلەکانی کرماشان کۆکردەوە بەسەر سەحنە، کەنگاوەرو دینەوەردا بەرەو سنە بەڕێ کەوت. هەواڵ بەخوسرەو خان گەیشت. ئەمیش هێزەکانی خۆی کۆکردەوە. نوسەری حدیقەو تحفە ئەڵێن: هێزەکەی ئەردەڵان بەهەموی 740 کەس بوە.

خوسرەو خان هێزەکەی ئەکا بە 7 بەشەوە. شەش بەشیان کەهەر یەکەی 100 سوار بوە بەیەکێ لە 6 کوڕەکەی ئەسپێرێ‌و، خۆیشی 40 سواری لەگەڵ ئەمێنێ. لەنیوەشەودا پێشـەنگی هـەردولا ئـەدەن بەیـەکـداو، لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا ئەبێ بەشەڕ. هێزی ئەردەڵان فێڵێکی جەنگی ئەکەن. بۆ ئەوەی هێزەکەی ئەڵڵاقولی خـان لەتۆپـو زەنبورەکەکانیان دور بخەنەوە، لەبەردەم هێزەکەی ئەڵڵاقولی خاندا پاشەکشە ئەکەن‌و، خۆیان بەشـکاو پیشان ئەدەن. ئەڵڵاقولی خان فەرمان ئەدا شەیپوری جەنگ لێ بدەن‌و، هێرشیان بـۆ بکـەن. هێـزی ئـەردەڵان لەناکاو لێیان ئەسوڕێن‌و تێیان بەر ئەبن. هەندێ ئەکوژن‌و هەندێ ئەگرن. ئەڵڵاقولی خان ئـەکوژرێ. شکسـت ئەکەوێتە لەشکری ئەڵڵاقولی خانەوە. دەس ئەکەن بەهـەڵاتن. خێـوەتی شـاهانەی ئـەڵڵاقولی خـان‌و، کەلوپـەلی بارەگاکەی‌و ران‌و رەوەی ئەڵڵاقولی خان کەوتە دەس لەشکری ئەردەڵان.

کەللەی ئەڵڵاقولی خان بەبراوی‌و، محەمەد رەشید بەگـو نەسیر خانی کولیاییـان بـەدیلی بـۆ خوسـرەو خان هێنا. والی رو ئەکاتە محەمەد رەشید بەگـو ئەڵێ: ".. بەشێلەو برۆیشەکەی خۆت قەناعەت بکەی باشـترە لەخواردنە خۆشەکانی بەغداو کرماشان!" (نیل: 32-33، حدیقە: 159-165، تحفە: 160-165).

نوسەری (نیل: 32) ئـەڵێ: 6ی جیمـادی ئـەوەلی 1199 کـاتی مردنـی عـەلیموراد خـان‌و، نوسـەری (حدیقە: 165) ئەڵێ رەبیعی ئەوەلی 1193 یەک مانگ دوای مردنی کەریم خـان‌و، نوسـەری (تحفـە: 165) ئەڵێ: رەبیعی ئەوەلی 1194 دوای مردنی کەریم خان.

## -10-
## جەعفەر خانی زەند و خوسرەو خان (1200)

دوای مردنی عەلیموراد خان، جەعفەر خانی کـوڕی هاتـە جێگـای. نـاکۆکی نێـوان خـانی زەنـدو ئاغـا محەمەد خانی قاجار لەسەر تاج‌و تەختی ئێران لەوپەڕی تونـدوتیژیدا بـو. هـەر یەکـەیان ئەیویسـت سـنوری قەڵەمڕەوەکەی خۆی فراوانتر بکاتو، ئەوی‌کە لەناو ببات.

جەعفەر خان لەئەسفەهانەوە هاتە هەمەدان. ئەیویست خانی ئەردەڵان بەلای خۆیدا رابکێشێ. پەیکـو پـەیامی بۆ خوسرەو خان ناردو، داوای لێ کرد بچێ بۆ سەردانی. خوسرەو خان بۆ راوێـژ ئـەعیانی ئـەردەڵانی کـۆکردەوە. قسە لەوە کرا کەگوێڕایەڵی بۆ جەعفەر خان دەرببڕن یا بەرهەڵستی بکەن. (حدیقە: 165)، (تحفە: 166).

نوسەری "سیر الاکراد" لەم بارەیەوە نوسیوێتی:

میرزا ئەحمەدی وەزیر کەباووباپیری پشتاوپشت لەکوردستاندا خاوەن پلەو نیشان بون... بەخوسرەو خانی وت: "خانەکانی زەند لەئێلییەتدا هەمیشە لەحاکمانی کـورد نـەویتر بـون. جگـە لەکـەریم خـانی وەکیـل کەخوابو بەدەلیلو هادی‌و گەیشتە پایەی سەڵتەنەت. دوای ئەو خزم‌و کوڕەکـانی لەگـەڵ یـەک کەوتنـە نیفـاق‌و ئیتیفاقیان تێدا نەبو. بەپێی رەوتی روداوەکان وا دەرئەکـەوێ لـەناوچونی دەوڵـەتی زەنـد رون‌و ئاشـکرایە. ئەگەر چەند ساڵێ کـەریم خـان لـەم دنیایـەدا ئیقبـاڵی بـو، چ پێویسـتە کەخوسـرەو خـانی والـی کوردسـتان گوێڕایەڵی فەرمانی جەعفەر خان بێ؟" (بابانی: 53-54).

نوسەری (حدیقـە: 165)، (تحفـە: 167) لـەو راوێـژەدا بڕیاریـاندا دژی جەعفـەر خـان رابوەسـتن‌و گوێڕایەڵی بۆ خانی قاجار دەربڕن. لەبەر ئەوە بەتوندی وەڵامی جەعفەر خانی دایەوەو، لەشکری ئـەردەڵانی سازدا بۆ شەڕو، هەواڵی بۆ خانەکانی خەمسەو گەڕوس نارد بەلەشکرەوە بێن بۆ یارمەتی دانی.

نوسەری (نیل گیتی گشا، میرزا عبدالکریم: 285) ئـەڵێ خوسـرەو خـان نامەیـەکی دڵسـۆزانەی بـۆ ناردبو کە لەشکری ئەو سولەیمانپایەیە خۆی ئەرکی هاتنی کوردستان نەکێشێ، ئەو مێرولە بـێ توانایـە نـەکا بەژێر سمی ئەسپەکانیەوە.

لەشکری ئەردەڵان بۆ بەرەنگاری خانی زەند بەرەو هەمەدان کشا. هێزی قەراگوزلو و خانەکانی خەمسەو گەڕوس گەیشتن و، لەبەهاری نزیک هەمەدان یەکیان گرتەوە.

لەشکری هەردولا دایان بەیەکدا (24ی شەعبانی 1200). ڕۆژی یەکەم شەڕ هەتا ئێواری درێژەی کێشا بێ ئەوەی بەسەرکەوتنی هیچ لایەک تەواو ببێ. ڕۆژی دوەم تێهەڵچونەوە. لای نیوەڕۆ لەشکری خانەکانی خەمسە بەشکاوی شەڕیان بەجێ هێشت. خوسرەو خان لەمە پەشۆکا. خۆی و کوڕەکانی بەدو هەزار سوارەوە بۆیان چونە مەیدانەوە. لەشکری زەندیان شڕ کرد. 1300 کەس لەهێزی زەند کوژراو 800 کەسیان لێ گیراو. 340 کەسیش لەهێزی ئەردەڵان کوژراو 54 یشیان بەسەختی برینداربون. مێژونوسەکانی ئەردەڵان بۆ ئەوەی جەعفەر خان سوکو خوسرەو خان زل بکەن ئەڵێن: خانی زەند چونکە قەڵەو ورگن بو، نەیتوانی بو هەڵێ لەناو سەنگەرەکانی تۆپخانەکەی‌دا خۆی قایم کردبو. کەشەو داهات یەکێ لەمەلا بەڕێزەکانی هەمەدانی بەقورئان و جەواهیرێکی زۆرەوە نارده لای خوسرەو خان بۆ ئەوەی ڕێگەی بدا بڕوا. خان پیاوەتی لەگەڵ کرد ڕێگەی‌دا لەگەڵ 3 کەس لەنۆکەرەکانی بڕۆن. هەر ئەو شەوە بەپەلە بەرەو ئەسفەهان گەڕایەوە. (حدیقە: 166)، (تحفە: 168).

دیارە لەگێڕانەوەی ئەم چیرۆکەدا هیچ لایەکیان: مێژونوسەکانی زەندو مێژونوسەکانی ئەردەڵان، بێلایەن نین، هەر لایەک لایەنی میرەکەی خۆی ئەگرێ و، زلتری ئەکا.

دوای ئەم سەرکەوتنە خوسرەو کەوتە فراوانکردنی قەڵەمڕەوەکەی. ناوچەکانی مەلایەر، تویسرکان، کزاز، فراهان، گوڵپایەگانی گرت. (تحفە: 167-168) لە گوڵپایەگان 3 ڕۆژ پشوی حەسانەوەی بەئۆردوەکەی‌دا. لەکۆڕێکی بەزمو ڕابواردن دا لەجەعفەر بەگ، یەکێ لەهاونشینەکانی، پرسی: "ئەم سەڵتەنەتەی ئێمە چۆن ئەبینێ؟" جەعفەر بەگ بۆ ئەوەی لەو بیرە پەشیمانی بکاتەوە ئەڵێ: "والی! پێ ڕاکێشانی زیادتر لەبەرە جگە لەمەینەتی و، قوتدانی پاروی گەورە جگە لەدرانی گەرو، شتێکی تری لێ پەیدا نابێ. شێلەو برویشکەی خۆمان لەهەمو خواردنێکی شاهانە خۆشترە!".

ئەم قسانە کاریان لەخوسرەو خان کردو، وازی لەبیری دامەزراندنی سەڵتەنەت هێنا. ڕۆژی دوایی دیلەکانی شەڕەکەی لەگەڵ نامەیەکی دڵسۆزی و چەردەیەک جەواهێری بەدیاری بۆ ئاقا محەمەد خانی قاجار، کەتازە خەریک بو بناغەی شایەتی دائەمەزراند، نارد. (حدیقە: 167)، (تحفە: 169).

## -11-
## سەرەنجامی خوسرەو خان

ئاقا محەمەد خان چەند جارێ هاتە هەمەدان، ئەیویست دەس بەسەر کوردستاندا بگرێ. بەڵام هیچ جارێ خوسرەو خان نەچو بۆ سەردانی، ئەترسا شتێکی لێ بکا، تەنانەت لەئاهەنگی تاجگوزاریشدا بەشدار نەبو. هەمو جار نامەی دڵسۆزی و گوێڕایەڵی و دیاری و پێشکەشی بۆ ئەناردو، خۆیشی لەقەڵای حەسەناوادا قایم ئەکرد. ئاقا محەمەد داوای لێ کرد یەکێ لەکوڕەکانی بنێرێ بەدایمی لەگەڵی بێ. (تحفە: 171) ئەمانوڵڵا خانی کوڕی و، لوتفعەلی خانی مامی نارد. ئاقا محەمەد ڕێزی زۆری گرتن و، بەڕێزەوە ناردنیەوە بۆ وڵاتی خۆیان. داوای لێ کرد کەخۆی و خان ئەحمەد خانی کوڕی بۆ دەربڕینی دڵسۆزی بچنە لای. والی ئەعیانی ئەردەڵانی کۆکردەوە ڕاوێژی پێ کردن. هەمویان هاتنە سەر ئەوەی کەدیسان ئەمانوڵڵا خان بنێرێتەوە بۆ دەرباری قاجارو، خۆیشی لەبەهاردا بچێ. لەبەهاردا، خان ئەحمەد خانی کوڕی لەجێگەی خۆی داناو، خۆی چو بۆ تاران بۆ سەردانی ئاقا محەمەد خان. خانی قاجار خوسرەو خانی گل دایەوە (1203). (تحفە: 172).

خوسرەو خان دوای ماوەیەک تێکچو. مێژونوسەکانی ئەردەڵان هەندێکیان ئەڵێن لەترسی ئاقا محەمەد خان شێت بوە (حدیقە: 168)، (تحفە: 173)، بەڵام مەردوخ ئەڵێ ئاقا محەمەد خان دەرمانخواردی کردوە.

ئێلاتی موکریو بلّباس کەبیستیان خان تێکچوە، ئەو هەلەیان بەدەرفەت زانی یاخی بون لەدەسەڵاتی ئەردەڵان. خان ئەحمەد خان بۆ ئەوەی بیانهێنێتەوە ژێر باری فەرمانبەری لەشکری بردە سەریان. لەگەڕانەوەدا یەکێ لەهێزەکەی خۆی کوشتی. ئەم هەواڵە کەگەیشتە خوسرەو خان، نەخۆشییەکەی توندتر بو. حەکیمەکان نەیانتوانی چاکی بکەنەوە. شا لەچابونەوەی نائومێدبو، لەجێگەی ئەو لوتفعەلی خانی مامی کرد بەوالی ئەردەڵانو، ڕەوانەی سنەی کرد (1204). لوتفعەلی خان 4 ساڵ بو بارمتە بو لەدەرباری قاجاردا.

پێ ئەچێ دوای ئەوەی خوسرەو خان نەخۆشیش کەوتوە، ڕێگە نەدرا بێ بگەڕێتەوە کوردستان، بۆیە بەو جۆرە مایەوە تا لەساڵی 1206 وەکو (لب: 147) ئەڵێ لەتاران مردو لاشەکەیان بەتەختەڕەوان برد بۆ پیرۆزگاکانو هەندێکی تریشیان ئەڵێن لەئەسفەهان مرد. (تحفە: 173، حدیقە: 169، نیل:37).

دور نیە ئەم نەخۆشییە (وراثی) بوبێ، چونکە پێش ئەمیش خان ئەحمەد خانو، دوای ئەویش ئەمانوڵڵا خان، توشی هەمان نەخۆشین بوەو، بەهەمان دەرد مردون.

## پاشکۆ

شێخ عەبدولموئمینی مەردۆخی بەبۆنەی لێخستنی خوسرەو خانەوە شیعرێکی داناوە. (در عزل عالیجاه معلی جایگاه معدلت پناه خسروخان ابن احمد خان واقع شد).

میرزام نەمەندەن
سەیران چارباخ چاخش نەمەندەن
نەمامان زویر، خاتر چەرکەندەن
ریشەی شادیشان جە بێخ داکەندن
گەرد ماوی تەم زەرگون نی دیار
بەرگ گوڵ زایف، تەرز توڵ زگار
عەرعەر قامەتان عوریان وە ماتەم
گوڵان، گوڵچینان، گشت ماتەن نە خەم
چەمەنان بێ نور، گوڵاڵان بەداخ
نەرگس جەمینان نەداران دەماخ
تەتاران بێ خەوف نە سای چناران
مەکەران سمکۆ هەر سوب ئێواران
مەگێڵان بێ باک سوب نەسەر شاخان
شەو، جاو مەکۆشان نە پای یاتاخان
پەی چی؟ پەی نەدین خان خوسرەو خو
کەیانی، کەی تەبع، کەیخوسرەو شکو
بێ نازو نیاز، نە موڵک عەجەم
جەم غوڵامش شێویان وەهەم
هەر ڕۆ پەرێ عەیش، شادیو بەشارەت

نمەیۆ نە پای عالی عەمارەت
هاهای کەڕەناو سەدای تەپڵو کوس
ئاموشۆی دیوان، میران وەپابوس
ئوتاخ بێ دەماخ، خانەران دڵتەنگ
نە مەی، نە مەینۆش، نە ساز چلچەنگ
نە تەختو نە تاج، نە سوپاو سانش
نەمەندەن نە ئەمر، حوکم فەرمانش
ئیسە وێنە فیکر هەئیەتی پەروەر
موجەڕڕەد مەندەن خان لال کەمەر
دوشمنان پەردەی شادی دەردەوە
خانان خەوفشان جەدڵ بەردەوە
مەهتاب نشینان ماوروی فەنامەن
بە سەیل ئەسرین تەڕ کەردەن دامەن
بێ سورمە، سپین دیدەی تەتاران
نور دیدەشان بەچەم مەداران
جەیرانان بێ خەوف شین بەباخان دا
بەسەهەندو حەوز، جای خوسرەو خان‌دا
واتەن بەیەکدێ، هەرکەس جە نەدوێ
دەستگای خوسرەوی شەوق نەمەندەن پێ
سارایی کۆ گەرد پۆکە نە سای سەنگ
چون خان مازول، مات مەندەن، بێدەنگ (مەردۆخی 333-334).

مەردۆخی ئەم شیعرەی وەکو خۆی نوسیویێتی: (در کنار اب رود شهر... وی رقم انشاد بژیرفت 1196)

کەخوسرەو خان عەزل ئەکرێو، لەشیراز گل ئەدرێتەوە، خان ئەحمەد خانی کوڕیو خێزانەکەیو دەسوپێوەندەکان رو ئەکەنە شارەزور. پێ ئەچێ شێخ موئمین یش، کەخەتیبی نوێژی هەینی سنە بوە، لەگەڵ ئەوان رۆیشت بێ، یان وەکو ئەڵێن ناردویانە بەدویاندا بیان هێنێتەوە، بەڵام بۆ دەربڕینی ناڕەزایی ئەویش لەوێ ماوەتەوە. پێ ئەچێ ئەو وشەیەی کوژاوەتەوە شەهرەزور بێو، ئاوی روبارەکەش چەمی زەڵم بێو، ئەو ئاو هەوا ناخۆشەی لەشیعرەکەدا باس کردوە ئاوهەوای دەشتی شارەزوری پڕ دوپشکو مارو مور، بێ.

میرزام وەگەردان
بدیە وەگەردش گەرون گەردان
ئەی زەدەی مەینەت، ئاوارەی هەردان
بێ تۆ چونش کەرد وێڵ سەرگەردان
کەفتیم وە مەسکەن عارەبانی بەڕ
یۆرد چۆڵگەردی قەیس ئەربەد گەڕ
شەو سەرد، رۆ گەرم، ئاب تەڵخو شور

جای ئەفعاو عەقرەب، ماهیو مارو مور
ماوای تاو لەرز، سەرێشەو سپڵ
یاگەی ئیستیسقاو سەفراو دەرد دڵ
شەو ڕۆ دایم تاقەت لێم سەندەن
هەر نیمە نامێم بەزۆر پێ مەندەن
ئەویچ هەم جە تاو دەرد فیراقەت
زەرڕێ، نیم لەحزە، نییەن فیراقەت
هەر نە پەژارەن، شەوانو ڕۆان
بێ خوردو بێ خاو، بێ تابو تەوان
وێڵ وێڵ مەگێڵۆ، بەیدی بە بەیدی
بێزار جاوایی، هەی نائومێدی
چەنی کۆهییان مەسکەن نە تونیم
چۆڵ ئەربەد گێڵ کۆهیو زەبونیم
ئاوارەی زامن، دورکەوتەی وڵات
کەس نی عەرزو حاڵ باوەرۆ وەلات
بەی گشت دەردەوە منەتبارەنان
بلا بەی مەینەت گرفتارەنان
هەرگیز نەپرسان هامسەران من
جە کۆن؟ جە کۆبو؟ کۆ کەرد بەزامن؟ (مەردۆخی: 335)
(در بیان عدالت معدلت دستگاه معلی جایگاه خسرو خان واقع شده)
میرزام نەمەندەن
روکن زەلالەت پایەش نەمەندەن
.. نەجام، خاتر پەڕ کەندەن
ریشەی شاخ زوڵم جە بێخ داکەندن
پەی چێش؟ کەپەروێز بەهزادی ئەڕەنگ
جانشین تەخت خانان ئەرژەنگ
بازبی بەساحێب تاج خوسرەوی
هامڕاو هامبەزم جیهان پەهلەوی
عەهد خوسرەوی تازە کەرد ئایین
بڵند بی ئاواز کۆس عەدڵ ئایین
هەرچەند جە زوڵمات سوپای زوڵمو جەور
تەمام بی سیا عەرزەی دون دەور
جە مەطلەع ئیحسان نور عەدالەت
سا چون طلوع کەرد، کەم بی زەلالەت
دڵ پەی نەقد عەدڵ ساکە بێ مەحەک

عەین عافیەت جێش نەبێ مونفەک
چون خاتر بەعەدڵ تەمام بی کامڵ
کەسر ئیقباڵش بەفەتح بی واسڵ
داد مەزلومان، فوقەراو مسکین
سەند جە زاڵمان ئەهل ئی زەمین
عەدڵو دادو عیلم، وەچەرخ سەر ساوا
زاڵم بەرد وەقەعر چای بێژەن ماوا
دوشمنان ئەبواب خەمان گوشاد کەرد
نە دڵ خەوفـو بیم بێ پەروا جا بەرد
خانان سەرحەد، تەمام جەسامش
داخڵ بین وە نەجم جەرگەی غوڵامش
پەروین ئەعداش، هەراسەندە بی
چون "بنات النعش" پەراگەندە بی
سوپای شادیو عەیش مەزلومان بەعام
تاراج کەرد ئەحشام زاڵمان یام
جە عەدلش ئەیمەن موڵکو مەملەکەت
حامی مەزلومان، ماحی زوڵمەت
بینای موڵک نیا جە چەدلش ئەساس
حوکم کەرد بەعەدڵ تەمام "بین الناس"
جە سایەش یاوا خەڵک بەئاسایش
چون سایە ساوان گشت نە سەر پایەش
سەریرش بەعەدڵ قایم کەرد پایە
پایە بڵند بۆ پەرێ سەر سایە
تاکە سارایی دورکەوتەی زامن
بیۆ نە زامن، بگیرۆ زامن! (مەردۆخی: 338-339)

(کەشـکۆڵە شـیعرێکی کـوردی "گـۆرانی" گردەوەکـۆیی شـێخ عبـدالمومنی مـەردۆخـی (1152-1211/1739-1797)، ساغ کردنەوەو سەرەتا نوسینی: ئەنوەری سوڵتانی، لەندەن 1998).

# حوسەینقولی خانی ئەردەڵان
# (.....؟-1263)

-1-

## ئەمانوڵڵا خانی گەورە (؟-1240)

ئەمانوڵڵا خانی گەورە یەکێ لەوالیە دەسەڵاتدارو هـەرە دەوڵەمەنـدەکانی ئـەردەڵان بـوە. بەرامبـەر رەعییەت، تەنانەت بەرامبەر خزمو کەسوکارەکانی خۆیشی، زۆر دڵرەقو بـێ بـەزەییو جنێـوفرۆش بـوە. لەپارە سەندنو ئەرز داگیرکردنو روتاندنەوەی دانیشتوانی قەڵەمرەوەکـەیدا چـاوچنۆکێکی زۆرداری بـێ نمونە بوە. بۆیە مێژونوسەکانی ئەردەڵان کەباسی سامانو دارایی ئەکەن، ئەڵێن گەیشتۆتە 6 کرور (تحفه: 200-201). لەوە 2 کروری موڵکـو خشڵو کەلوپـەلی مـاڵو گەلـەو رەوەو رانو 4 کرورەکـەی تریشـی زێڕی نەختینە بوە.

لەگەڵ ئەوەشدا بایـەخی زۆری داوە بەئاوەدانکردنـەوەی وڵات. کۆشـکو سـەرا، خـانو کاروانسـەرا، بازارو دوکان، حەمام، مزگەوتی... دروست کردوە. یەکێ لەشوێنەوارە گرنگەکانی مزگـەوتی "دار الاحسان"ـە کە لەهەمان کاتدا ناوەندێکی گرنگی خوێندەواری بوە. هەروەها کتێبخانەیەکی ئاوەدانی هەبوە کتێبی ناوازەو دەگمەنی وەکو شەرەفنامەی تێدا بوە، کەدانەیەکیانی بەدیاری داوە بەریچ.

ئەمانوڵڵاخان چەندین ژنی هێناوەو چەندین منداڵی نێرینەی لێیان بوە. لەوانە محەمـەد حەسـەن خـان، خوسرەو خان، محەمەد صادق خان، عەباسقولی خان، حوسوینقولی خان، ئەبولفەتح خـان... جیـاوازی پایـەی کۆمەڵایەتی بنەماڵەکانی دایکی ئەم کورانە کاری لەپاشەرۆژیان کردوەو، ناکۆکی لەنێواندا دروست کردون.

لەناو کورەکانیدا هەندێکیان شاعیر بون لەوانە:

حوسەینقولی خان کەشاعیرێکی بەتوانا بوە، بەنازناوی "حاوی" زۆر شیعری بەفارسی دانـاوە. حـاوی لەباوکەوە لەناو ئەم بنەماڵەیەدا پێ گەیشتوە. دایکیشی: خورده خانم، کچی محەمەد ئاغای قـادری، خوشـکی ئەبولحەسەن بەگی باوکی مەستوره بوە. بەم پێیە لەگەڵ مەستوره خاڵۆزاو پورزا بون.

هەروەها خوسرەو خان، کەدوایی بو بەوالیو دواتر بو بەهاوسەری مەسـتوره، ئـەویش شیعردۆسـتـو، هەندێ جار خۆیشی شیعری داناوە.

**–2–**

### ژنهێنانی حوسەینقولی خان

ساڵی 1236 ئێلی جاف زیانییان کردبو، خەڵکی مەریوان سکاڵایان بردە بەر ئەمانوڵڵاخان. ئـەویش ئەم هەلەی بەدەرفەت زانی لەشکری کۆکردەوە چوە سـەریان، لـەنزیک مـەریوان گـەمارۆی دان. هەنـدێکی لـێ کوشتنو هەندێکی لێ گرتن، نزیکەی دو کرور رانو رەوەی بەتاڵان بردن. لەهیچ سەردەمێکی پێشتردا زیـانی وا زۆر لەجاف نەکەوتوە. (تحفە: 193) لەسەرانی جاف وەلەد بەگـو کورەکانی: رۆستەم بەگـو حەبیب بەگ، لەناو گیراوەکاندا بون. وەلەد بەگ لەزینداندا مایەوە تا وەک(مستورە: 191) ئـەڵێ: "بـەر نەوازشـتی والـی کەوتـو لێی خۆش بو، یەکێ لەکیژە بەئابڕوەکانی، کە بەڕاستی لەئاسمانی داوێنپاکیو جوانیدا مـانگی تابـان بو، دا بە حوسەینقولی خانو سەری پێ بڵیند کرد..".

**–3–**

### ژنهێنانی خوسرەو خان

فەتحعەلی شا نزیکەی هـەزار ژنـی هـەبوە. یـەکێ لـەو ژنانـەی، سـەروناز خـانمی، بـەدیاری بەخشـی بەئەمانوڵلاخان. فەتحعەلی شا لەژیانی خۆیدا لەو ژنانەی نزیکەی هەزارو پێنج سەد کورو کچو نەوەی هەبوە. ئەمانوڵڵا خان، یەکێ لەکچەکانی فەتحعەلی شـا، حوسـنی جیهـان خـانمی، بـۆ خوسـرەو خـانی کـوری هێنـا. خەرجی ئەم ژنهێنانە، بەقسەی (مسـتورە: 191) 100 هـەزار تمـەنو، بەقسـەی (بابـانی: 71) 200 هـەزار تمەنو، بەقسەی (تحفە: 194) 224 هەزار تمەنی ئەو سەردەمەی تێ چوە. لەسەر ئەمە محەمەد حەسـەن خـان لەباوکی زیزو هەڵگەڕایەوە، چونکە ئەمەی بەنیشانەی ئەوە لێک دایەوە کـەباوکی خوسـرەو ئامـادە ئـەکا بـۆ جێنشینی خۆی، لەکاتێکدا ئەم خۆی بەشایانی بوکی تایـەنو جێنشـینی دائـەنا. لەشـەڕێکی خوێنـاویدا کـە 440 کەسی تێدا کوژراو 110 کەس، کـە بـەدیل گیرابـون، ئـەوانیش بەفـەرمانی ئـەمانوڵڵا خـان کـوژران، محەمەد حەسەن خان کوژرا. دیلەکانی بەباوکـو براکانیان کوشت (1237). (حدیقە: 177) ئەم زەماوەنـدەی خوسرەو خان رەنگە گرانترین شایی مێژوی کوردەواری بێ لەڕوی تێچونی خوێنی زۆرو پارەی زۆرەوە!

ئەمانوڵڵا خان ساڵی 1240 مرد. بەر لەمردنی بەچەند ساڵێ توشی نەخۆشینی ئەقڵیی بوە. هۆی ئەمە ئەگێڕنەوە بۆ کوژرانی کورەکەی.

**–4–**

### خوسرەو خانی ناکام

خوسرەو خان لەجێگەی باوکی لەتەمەنی 19 ساڵیدا بو بەوالیی ئەردەڵان. دیارە زاوایەتی لەگـەڵ شـا لەمــەدا دەوری هــەبوە. خوســرەو خــان بەپێچەوانــەی باوکیــەوە، پیــاوێکی بــەرچاوتێرو دەســبڵاو بــوە. مێژونوسەکانی ئەردەڵان هەڵوێستێکی جوامێرانەی لێ ئەگێڕنەوە:

ساڵی 1243 قاتوقڕیو گرانی وڵاتی داگرت. خەڵکی لەبرسانیدا ئەمردن. خوسرەو خان نزیکەی 50 هەزار تەغار گەنمو دانەوێڵە، کە لەعەمارەکانیدا بو، بەسەر خەڵکدا دابەشی کرد، "سەنەد"ی لێ وەرگرتن کەدوای بەسەرچونی گرانیەکە نرخەکەی بیژێرن. خەڵک لەبرسێتی رزگاریان بو. پاش ماوەیەک بوژانەوە. میرزا فەرەجوڵڵا خانی وەزیر سەنەدەکانی هێنا بۆ خوسرەو خان تا فەرمانی وەرگرتنەوەی نرخەکانیان بدا. نرخی ئەم سەنەدانە بایی زیاتر لە 150 هەزار تمەن بو. خوسرەو خان هەمو سەنەدەکانی دایە ناو ئاگرو سوتاندنی. (حدیقە: 178-179).

وەزیر لۆمەی والی کرد چونکە ماڵو دارایی بەخۆڕایی بەفیڕۆ ئەدا. بەڵام خوسرەو خان وتی: "...ئینسافتان بێ! 700 ساڵە ئەهالی ئەم مەملەکەتە بەگیانو ماڵ خزمەتی ئەم بنەماڵەیە ئەکەنو، گیانو ماڵی خۆیان وەقفی رەزای ئەم بنەماڵەیە کردوەو، شاردراوە نیە کەموڵکو دەوڵەتو ئیعتبارو مەکنەتی بنەماڵەی ئێمە لەقازانجو سودی ئەم رەعییەتە حەقگوزارانەوەیە. هەمو کات ئێمە لەوانمان وەرگرتوەو نانو خواردنی ئەوانمان خواردوەو، موڵکو دەوڵەتی ئەوانمان بەهەر جۆرێ بێ بردوە، ئێستاش کە بەتەقدیری خوایی، ئەهالی ئەم مەملەکەتە یەک ساڵ توشی بەڵای قاتوقڕیو گرانی بونو، بون بەمیوانی سفرەو خوانی ئێمە. بەکام ئینسافو مروەت جائیزە مەئمورانی توندگر بنێرمو نرخی نانو خواردنیان لێ داوا بکەم." (تحفە: 202-203).

لەگەڵ ئەم دەسبڵاویەدا، لەپارەسەندنو، تاڵانکردنو، توندوتیژی سزاداندا، چەپی لەباوکی گەڕاوەتەوە. تەنانەت لەگەڵ باوک براکانیشیدا بەوپەڕی دڵڕەقیەوە جوڵاوەتەوە:

عەباسقولیخانی زڕبرای، لەپلەوپایەی سەردەمی باوکی روت کردەوەو، خۆیو دایکی تاڵان کردو هەرچی سامانو داراییان هەبو، هەموی لێ زەوت کردن. (مستورە: 199)

"حوسەینقولی خانی برای، کە لەسەردەمی باوکیدا فەرمانڕەوایی ئیسفەندئابادی پێ سپێردرابو، سەرەڕای هەمو ملکەچیو گوێڕایەڵییەکی، دوای ماوەی ساڵێک، دەستی لەکار کێشایەوەو لای بردو فەرمانڕەوایی ناوچەکەی بەباباخانی مەراغەیی سپارد. حوسەینقولی خانی بێ چارەیش هیچی بۆ نەمایەوە، هەر ئەوەندەی بۆ لوا، هەرچی سەروەتو سامانێکی نەختینەی هەبو پێچایەوەو بەقورئانێکەوە، بەهەڵەداوان چو بۆ خزمەت خوسرەو خان، رای گەیاندێ: ئەوەی هەیەتیو نیەتی، هەر ئەمەیەو بەس، ئیتر هەڵی گرەو لەکۆڵم بەوەو رێسی ملم مەخە ژێر بیوری سەربڕەوە." (مستورە: 199).

محەمەد صادق خان، زڕبراکەی تری، دو جار تاڵان کردو هەرچی هەبو لێی سەند، تەنانەت کارەکەرەکانی چێشتخانەکەیشی بەتاڵان بردو بەنۆکەرەکانی خۆی بەخشی (تحفە: 203).

نوسەری (لب: 181)یش ئەڵێ: "ئەگەرچی جودو عەتای زۆری هەبو بەڵام نوسەری ئەم کتێبەی لەوپەڕی زیللەتو برسێتیدا بەجێ هێڵا".

خوسرەو خان تەنیا 10 ساڵ حوکمڕانی کردو بە29 ساڵی مرد (1250)، لەبەر ئەوە پێی ئەڵێن: خانی ناکام، واتە جوانەمەرگ. لەحوسنی جیهان 3 کوڕ: رەزاقولی، ئەمانوڵڵا ناسراو بەغولامشا، خان ئەحمەد خان، و 3کچی هەبوە. کوڕە گەورەکەی 10 ساڵ بوە، بەڵام لەجێگەی باوکی کراوە بەوالیی کوردستان. دیارە لەم دانانەشدا دایکی دەوری کاریگەری هەبوە.

**-5-**

## رەزا قولی خان

حوسنی جیهان بۆ ئەوەی ئەم بنەماڵەیە زیاتر بەستێتەوە بەدەرباری قاجارەوە، توبا (طوبی) خانمی کچی عەباس میرزاو، خوشکی محەمەد شای بۆ رەزاقولی کوڕی هێنا. رەزاقولی کەگەورە بو کاروباری گرتە دەس، نێوانی لەگەڵ دایکی خۆش نەبو، هەروەها لەگەڵ براکانیو مامەکانی.

**-6-**

## مەعرەکەی دەشتی مەریوان (1257)

ساڵی (سەرەتای 1257ک/ 1841ز) مەحمود پاشای بابان سلێمانی بەجێ هێشتو، پەنای بۆ رەزاقولی خان برد. پاش ئەوەی سەرنانی دەرباری قاجاریان کرد گەڕانەوە بۆ ئەردەڵانو، بۆ ئەوەی مەحمود پاشا بیاتەوە سەر موڵکی بابان، لەشکری ساز دا هێزەکەیان کرد بەدو بەشەوە: بەشێکیان بەسەرکردایەتی ئەمانوڵڵا بەگی وەکیل لەگەڵ مەحمود پاشا نارد بۆ سەر سلێمانی. بەشەکەی تریان لەگەڵ والی لەمەریوان بارگەیان خست. مەحمود پاشاو لەشکرەکەی هێنا بوی بەبێ شەڕ گەیشتە نزیک سلێمانی (تحفە: 218-224)، (حدیقە: 181-183).

ئەم لەشکرکێشیەی والی ئەردەڵان بۆ گێڕاندنەوەی مەحمود پاشا بۆ سلێمانی، پێچەوانەی ماددەی یەکەمی پەیماننامەی ئەرزڕوم بو، کە لەساڵی 1238 (28ی تەموزی 1823ز)دا لەنێوان ئێرانو عوسمانیدا بەسترا بو.

ئەگەرچی مەحمود پاشا لەگەڵ ئەو هێزەی بۆ پشتیوانی لەگەڵی هات بو، بێ شەڕو بەرەنگاری، گەیشت بونە سلێمانی. بەڵام عەبدوڵڵا پاشای بابان، لەناکاو هەڵی کوتایە سەر بارگەو بارەگای والی لەدەشتی مەریوان. هێزەکەی والی تەفروتونا کردو، ژمارەیەکی زۆر لەپیاوە ناسراوەکانی ئەردەڵان کوژران. بەبیستنی ئەم هەواڵە مەحمود پاشاو ئەو هێزەی لەگەڵی بو، ورەیان بەردا سلێمانییان بەجێ هێشتو گەڕانەوە سنە.

**تێبینی:** بۆ درێژەی ئەم شەڕە بڕوانە: (مستورە: 210-215)، (حدیقە: 181-182)، (تحفە: 218-221).

**-7-**

رەزا قولیخان دوای تێکشکانی لەمەریوان، پیاوماقوڵێکی خۆی بەناوی میرزا عەبدولمەجیدەوە ئەنێرێ بۆ تاران، بۆ ئەوەی روداوەکە بۆ کاربەدەستانی دەرباری قاجار رون بکاتەوە. میرزا عەبدولمەجید نەوەی میرزا شوکروڵڵاو ئامۆزای میرزا هیدایەتوڵڵای وەزیر، فەرمانڕەوای جوانڕۆو عێلی جاف بو. "لەسەرگرانیو سەرراستیو زیرەکیو ژیریدا ئیفلاتونی دوەم بو..." بەڵام دەسبەجێ مەجید ئەگرنو ئەیکوژن. (مستورە: 215)، (حدیقە: 183)، (تحفە: 223)

حوسەینقولی خان بەم بۆنەیەوە شیعرێکی 18 بەیتی بەسۆزی لەشیوەنیدا داناوە. لەدوا بەیتیدا ئەڵێ:

سال این سوک نمایان وقت این نقش شگرف

زد رقم حاوی شهید دوست شد عبدالمجید (1257)

لەسەر شەڕی مەریوان رەزاقولی لەوالیەتی خرا. لەجێگەی ئەو، وەزیرەکەی، کەئەمان تاوانباریان ئەکرد بەخیانەت، دانرا کاروباری ئەردەڵان بەڕێوە بیا. حوسەینقولی خان، مامی رەزاقولی خان، ئەگەرچی لەناکۆکی ناو بنەماڵەکەیاندا دژی ئەمو لایەنی ئەمانوڵڵا خانی گرتوە، بەڵام لەتێکشکانی ئەردەڵان زۆر نارەحەتو، بۆ کوژراوەکانی دڵتەنگ بوە. لەسەر ئەو روداوانە چەند قەسیدەی بەفارسی داناوە. لەسەرەتای شیعرێکی 26 بەیتیدا ئەڵێ:

نطع بازی قضا در تختەی کیهان کشاد

مهرەی بدنامی اندر طاس کردستان فتاد

لەو تێکشکانەدا مێژونوسەکانی ئەردەڵان تاوانی خیانەت ئەدەنە پاڵ میرزا هیدایەتوڵڵا، گوایە پلانێکی خراپی بۆ شەڕەکە داناوە بۆ ئەوەی لەشکری ئەردەڵان بشکێ، لەهەمان کاتدا هەواڵی بۆ عەبدوڵڵا پاشاش ناردوە هێرش بکاتە سەر بارەگای رەزاقولی خان. (مستورە: 213)، (حدیقە 181)، (تحفە: 220)

حوسەینقولی خانیش هەمان تاوان ئاراستەی هیدایەت ئەکا، هەر لەو دەوروبەرەدا شیعرێکی 50 بەیتی لەسەر شەڕەکەو لەسەر حکومەتەکەی میرزا هیدایەت داناوە، سەرەتاکەی بەمە دەس پێ ئەکا:

زنسل اردلان اصل سنندج تا که بنیاد شد

ب طومار ممالک اردلان اباد عنوان شد

حوسینقولی سیاسیەکی ڕۆشنبیرو شاعیرێکی بەتوانا بوە. بەشێکی گرنگی شیعرەکانی لەحدیقەی ئەمانوڵلاهی‌دا کۆکراوەتەوەو چاپ کراوە. هەروەها نامیلکەیەکی ئەدەبیی دریژی تێکەڵاو لەپەخشانو شیعر کە بەبۆنەی جوانە مەرگ بونی کوڕێکی خاڵۆزایەوە دای ناوە.

**-8-**

## دو گێڕانەوەی جیاواز

گێڕانەوەکەی عەبدوڵڵا پاشا، کە لەنامەیەکدا بۆ کاربەدەستانی عوسمانی نوسیوە، لەهەندێ شوێندا لەگەڵ گێڕانەوەکانی مێژونوسەکانی ئەردەڵاندا یەک ناگرێتەوە.

عەبدوڵڵا پاشا بەپێچەوانەی گێڕانەوەی مێژونوسەکانی ئەردەڵانەوە، وا ئیدیعا ئەکا کەشەڕەکە لەنزیک ئۆردوگاکەی ئەمان لەقزڵجە لەناو ئەرزی عوسمانیدا، واتە لەقەڵەمڕەوی بابانا قەوماوە، نەک لەناو خاکی ئێراندا. بەڵام هەمو سەرچاوەکان وا ئەگێڕنەوە کەشەڕەکە لەمەریوان بوە. تەنانەت سالم لەو شیعرەدا کە بەبۆنەی هەواڵی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشاوە وتویەتی، ئەڵێ: "ڕموەشێنێ مەعرەکەی دەشتی مەریوان هاتەوە" ئەو کاتە مەریوان بەشێ بوە لەقەڵەمڕەوی ئەردەڵان، واتە ئەرزی ئێران بوە.

عەبدوڵڵا پاشا لەنامەکەیدا ئەڵێ ئەوان پەلاماری ئێمەیاندا چونکە وایان زانی ئێمە ژمارەمان کەمە، کەچی هەمو سەرچاوەکان وا ڕائەگەیەنن، کە لەشکری والی لەدەشتی مەریوان هەڵی داوەو، عەبدوڵڵا پاشا لەناکاو هەڵی کوتاوەتە سەریان. عەبدوڵڵا پاشا زۆر لەسەر تێشکانی والیو، ئەو زەرەرە گیانییەی لەهێزەکەی گەورەپیاوانی ئەردەڵانو، ناوبانگی والی کەوتوە، نەدواوە، بەڵکو باسی ئەو زەرەرە زۆرە ئەکا کە لەسلێمانیو شارەزور کەوتوە.

مێژونوسەکانی ئەردەڵان هۆی ئەم تێشکانە ئەدەنە پاڵ خیانەتی میرزا هیدایەتوڵڵای وەزیری والی. وا ئەگێڕنەوە کاتێ والی لەتاران بوە لەکۆڕێکی تایبەتی خۆیدا هەڕەشەی کوشتنی لەمیرزا هیدایەتوڵڵاو میرزا جەعفەری کوڕی کردبو. میرزا هیدایەتوڵڵا ترسی ئەوەی ئەبێ کە ئەگەر والی بەسەرکەوتویی لەسەفەرەکەی بگەڕێتەوە ئەم لەناو بیات، لەبەرئەوە گوایە: هەم تەگبیرێکی خراپی بۆ نابەشکردنی هێزەکانی والی کردوەو، هەم بەنهێنی پێوەندی لەگەڵ عەبدوڵڵا پاشادا هەبوە. لەجموجوڵی لەشکرەکەیان ئاگاداری کردوە.

ڕەنگە ئەمە بیانو بێ بۆ ئەو شکستە قورسەی بەسەر والیدا هاتوە، یان توهمەیەک بێ بۆ شکاندنی کەسایەتی میرزا هیدایەت. میرزا هیدایەت لەبنەماڵەی ئەردەڵان نەبوە، بەڵام لەجێگەی ئەوان کراوە بەحاکمی ئەردەڵان. ئەگەر وەکو ئەوان ئەڵێن خائین بوبێو، هاوکاری ژێربەژێری لەگەڵ پاشای بابان کردبێ بۆ شکاندنی لەشکری ئەردەڵان، شای ئێران چۆن دوای ئەم کارەساتە راستەوخۆ لەجێگەی ڕەزاقولی ئەمی بەحاکمی ئەردەڵان دائەنا.

**-9-**

## کۆچی حوسەینقولی خان بۆ سلێمانیو مردنی

سەردەمی کوڕانی خانی ناکام نا ئارامو پڕ لەپیلانگێڕانو شەڕوشۆڕ بوە.

ڕەزاقولی خان لەساڵانی (1250-1257) بەناو والیی ئەردەڵان بو، بەڵام کاربەدەستی ڕاستەقینە والیە (حوسنی جیهان خانمی دایکی) بو. ڕەزاقولی بەهۆی تێکشکانەی مەریوانەوە لێخرا، ئەو و براکانی برانە

تاران دەسبەسەر دانران. کاروباری ئەردەڵان بەمیرزا هیدایەت سپێردرا (1257-1258). جاری دووەم سەرلەنوێ رەزاقولی خان دانرایەوە بەوالی (1260-1261) بۆ ئەوەی بتوانێ کاروبارەکانی بێکێشەو گیروگرفت بەرێوە ببا، ئەمانوڵڵا خانی برایو، مامەکانی: حوسەینقولی خان، عەباسقولی خان، لەگەڵ میرزا هیدایەت بۆ ئەسفەندئاباد دور خرانەوە (مستورە: 217).

ئەم گوریسێنەی نێوان ئەم دو برایە لەسەر دەسەڵات هەمو خەڵکی وڵاتی تێوە گلابو. زۆری نەخایاند رەزاقولی خان لابراو، ئەمانوڵڵا خان (1261) لەجێگەی دانرا. لەسەردەمی ئەم دا داورودەستەی رەزاقولی خان بۆ ئەسفەندئاباد دور خرانەوە. هەندێ لەگەورەپیاوەکانی ئەردەڵان رویان کردە بابانو هەورامان. ئەمانوڵڵا خان پێشکارەکەی رەزاقولی خانی برای لەزیندان دا کوشت (فخر الکتاب: 228).

بۆجاری سێیەم دیسان رەزاقولی خان کاروباری گرتەوە دەس (1261-1263). بەتوندی تۆڵەی لەوانە کردەوە دەستیان لەکوشتنی پێشکارەکەیدا هەبو. دانی یەکێکیانی دەرهێناو بهچەکوش دایان کوتا بەکەللەی سەریداو، 3 پەنجەی نوسینی "مونشی باشی" بری. (فخر الکتاب: 230).

زەبروزەنگی درندانەی هەردو برا زۆر کەسی ئاوارە کردوە، یەکێکیان حوسەینقولی خان بوە. لەم بارەیەوە (مستورە: 229) نوسیوێتی: "حوسەینقولی خان کە بەفەرمانی نەواب ئەمانوڵڵا خان پاراستنی کەوشەنو بومی رەوانسەری پێ سپێردرابو، بەدەست خەڵکی ئەو ناوچەیە تاڵان کراو دەستدرێژیەکی زۆری لێ کرا... ئەویش بەناچار لەگەڵ دوسێ کەسێکدا گیانی خۆی بەهەزار شەرەشەق رزگار کردو سا بەهەر جۆرێ بو، لەرێی ئەفشارەوە خۆی گەیاندە سولەیمانیو خزایە پاڵ عەبدوڵڵا پاشای بابانەوە".

حوسەینقولی خان ژیانێکی نائارامی بەسەر بردوە، بەتایبەتی دوای مردنی باوکی. هەر لەماوەی ژیانی ئەمدا 3 جار رشانەوەو تاعون لەناوچەکەدا داکەوتوە (ساڵانی، 1246، 1250)و، بەکۆمەڵ خەڵکی کوشتوە. چەند جارێ بەشداری شەڕ بوەو، چەند جارێ تاڵان کراوەو، توشی "دەستکورتیو تەنگانەی بژێو و بەرێوەچون" بوە. لەنێوان سنە، ئیسفەندئاباو جوانرۆو رەوانسەردا جێگۆرکێ کردوە، تا سەرەنجام لەسلێمانی لەرۆژی 14ی مانگی زیلحیجەی 1263 ک (1846/11/23ز)دا بەوەبایەکی کوشندە، کەرەنگە کۆلێرا بوبێ، لەئاوارەییدا سەری نایەوە. (مستورە: 238).

هەلومەرجی سیاسی سەردەمی ژیانی حوسەینقولی خان نائارامو ئاڵۆز بوە. خۆیشی چەند جارێ دوچاری راونانو گرتنو دورخستنەوەو تاڵان کران هاتوە. بەشێکی گرنگی شیعرەکانی حوسەینقولی رەنگدانەوەی ئەو نائارامیو ئاڵۆزانەیەو، ئەچێتە خانەی شیعری سیاسیەوە. بۆ لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی ئەو قۆناغەی ژیانی میرایەتی ئەردەڵان نرخێکی زۆریان هەیە. ئەهێنێ ئەم شیعرانەی لەفارسیەوە بکرێنە کوردیو، بەلێکۆڵینەوەی مێژوییەوە بڵاو بکرێنەوە.

وەکو شێخی خاڵ لەفەهرستی دەسنوسەکانی کتێبخانەکەیدا نوسیوێتی ئەبێ دیوانەکەی حوسەینقولی خان کەوتبێتە کتێبخانەکەی ئەوانەوە. هەوڵێکی زۆرمدا بۆ ئەوەی چاوێکی پێدا بگێرمو بزانم ئاخۆ هیچ شیعرێکی بەکوردی هۆنیوەتەوەو هیچ شیعرێکی سیاسی تری داناوە کە لەحەدیقەی ئەمانوڵڵاهیدا بڵاو نەکرابێتەوە، بەڵام سەرکەوتو نەبوم. هیوادارم لەدوارۆژدا کەسێکی کە ئەم کارە ئەنجام بدا.

**–10–**

### ئەنجامەکانی شەڕی مەریوان

دەشتی مەریوان ناوچەیەکی ستراتیجی بوە لەنێوان رۆمو عەجەمو، لەنێوان بابانو ئەردەڵاندا. گرتنی مەریوان کلیلی گرتنی شاری سنەو، ناوچەی ئەردەڵان بوە. لەم دەشتەدا چەندین جار شەڕی خوێناوی قەوماوە.

خوسرەو پاشای سەرداری ئۆردوی رۆم لەدەشتی مەریوان زەینەڵ خانی سوپا سالاری قزلباشی شکاند (1040) و هەتا هەمەدان پێشرەوی کرد.

خان ئەحمەد خان، کەروی لەدەرباری سەفەوی وەرگێڕاو هێزی عوسمانی هێنا بۆ ئـەوەی دەس بەسـەر ناوچەکەدا بگرێتەوە، لەگەڵ لەشکری سەفەوی لەمەریوان لێکیان دا (1046). خان ئەحمەد شکاو کشایەوە بـۆ موسڵو، هەمان ساڵ لەوێ مرد.

میر سلێمانی بەبەو، لەشـکری سـەفەوی بەسـەرکردایەتی عەباسـقولی خـانی قاجـار هـەر لـەم دەشـتەدا بەرەنگاری یەک بونو، سلێمان شکا (1111) و، عەباس قولی قەسابخانەیەکی بۆ کوردەکانی ئەردەڵان دانا.

خانە پاشای بابانیش هەر لەمەریوانەوە کشا بۆ گرتنی ئەردەڵان (1136).

سەلیم پاشـای بابـان (1163) کـەچو بـۆ گرتنـی ئـەردەڵان لەمـەریوان حەسـەنعەلی خـانی شـکاندو، ناوچەکەی لێ داگیر کرد. (ذیل: 28).

محەمەد پاشای بابان لەدەشتی مەریوان لەشکری خوسرەو خانی دوەمی شکاند (1191).

ئەورەحمان پاشای بابان بەیارمەتی هێزی ئێران، لـەناکاو لـەم دەشـتەدا هـەڵی کوتایـە سـەر لەشـکری والی بەغداو، شکاندیو سلێمان کەهیەی سەرکردەی لەشکرەکەی بەدیل گرت (1221).

هەر بەو جۆرە چەندین شەڕی تر.

ئەم شەڕەیش، مەعرەکەی دەشتی مـەریوان (1257)، ئەڵقەیـەک بـوە لـەزنجیرەی ئـەو شـەڕانەی، لـەم دەشتەدا، بەدرێژایی چەند سەدە لەنێوان ئەم دو میرایەتیەدا، سا ئیتـر بەیارمـەتی لەشـکری رۆمو عەجـەم یـان بەبێ یارمەتی ئەوان، قەوماوە. بەڵام گرنگی ئەم شەڕەیان لەوەدایە دوایـین شـەڕبو، چونکـە دوای ئـەم شـەڕە بەماوەیەکی کورت، ئەم دو ئەمارەتە ئیتر روخانو، لەڕوداوەکانی ناوچەکەدا دەوریان نەما.

وەکو نوسەرانی (حدیقە: 182) و (تحفـە: 221) ئـەڵێن: شـەڕەکە لـەرۆژی 4 شـەممە 14ی رەبیعـی یەکەمی 1257دا قەوماوە. ئەم تێشکانە، هەروەکو تێشکانی رەزاقولی خانو میرایەتی ئەردەڵان بـو، بەهـەمان ئەندازە بگرە زیاتر، تێشکانی مەحمود پاشاو پاشایەتی بابان بو. ئەم روداوە زیاتر پاڵی بەهەردو دەوڵەتـەوە نا زوتر هەوڵی بەلاداخستنی کێشەکانی سنورو، دانانی سنورێ بۆ ئەم جـۆرە گیروگرفتانـە دابنـێن. ئـەوەبو هەردو دەوڵەت لە 16 ی جیمادی یەکـەمی 1263 (1ی نیسـانی 1847ز) پەیماننامـەی دوەمـی ئـەرزرۆمیان بەستو بناغەی هەڵوەشاندنەوەی میرایەتیە کوردیەکانیان دانا.

**–11–**

## کۆتایی ئەمارەتی ئەردەڵان

بەبیانو ئەوەی لەگەڵ یەکێ لەمیرەکانی قاجار خەریکی پیلانگێڕانە، محەمەد شا، رەزاقولی خانی لابردو، خوسرەو خانی گورجی نارد بۆ گرتنی. خوسرەو خان، رەزاقولی خانی بەگیراوی ناردە تارانو خۆی حوکمی ئەردەڵانی گرتە دەس (1263-1264). دوای ئـەمیش بـۆ جـاری چـوارەم رەزاقـولی خـان (1264) و، بـۆ جاری دوەم دیسان ئەمانوڵڵا خان (1265-1276) بون بەوالی. سـەرەنجام ناسـرەدین شـا، فـەرهاد میـرزا موعتەمیدەل دەولە، کەمامی خۆیو خاڵۆی کورەکانی خوسرەو خان بو، نـارد بـۆ سـنەو، بەیـەکجاری کۆتـایی بەداوودەزگای دێرینەی ئەمارەتی ئەردەڵان هێنا.

# پاشکۆ

نامەی عەبدوڵڵا پاشای بابان، کە لەڕۆژی 5ی جیمادی دوەمی 1258 (14ی تەموزی 1842) دا بەبۆنەی ئەم شەڕەوە نوسیوێتی، لەڕێگەی ئەحمەد پاشای برایەوە ناردویەتی بۆ کاربەدەستانی عوسمانی. ئەحمەد پاشاش نامەکەی بۆ سەرعەسکەری ڕۆم لەئەرزڕوم ناردوە، ڕەوتی روداوەکان بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

"لەهاتنی والی سنەو مەحمود پاشا بۆ سەر سنوری ولایەتی شارەزورو، لەدەستدرێژییانم ئاگادار کردبون. درێژیی باسەکە بەمجۆرەیە:

ڕەزاقولی خان والی سنە بۆ دانانی مەحمود پاشا لەسلێمانی بەهێزێکی زۆرەوە لەسنەوە بەڕێ کەوت تا گەیشتە سەر سنوری شارەزور. لەهەمو لایەکەوە ئاژاوەو پشێوییان نایەوە. لەشکری هەورامانیان نارد مەحاڵەکانی گوڵعەنبەرو هەڵەبجەیان داگیر کرد. لەلایەکی ترەوە مەحاڵەکانی قزڵجەو تەرەتوڵو ئالانو سیوەیلیان گرتو، پیاوی خۆیان بۆ حوکمڕانی لەسەر دانا. لەبەر ئەوەی کار بەم رادەیە گەیشتو پێی بێگانە داخڵی موڵکی مەحروسەی شاهانە بو، غولام ناچار بو لەشاری سلێمانییەوە بۆ پاراستنی سنورەکان چومە شارەزور. حسێن ئاغای ئەندەرونیو حاجی محەمەد ئاغای میرئاخوڕی پێشوم ناردە لای والی ناوبراو کەئەم جۆرە جوڵانو ڕەفتارانەی بەرامبەر مەمالیکی مەحروسەی شاهانەی ئەنوێنێ، بەتەواوی پێچەوانەی مەرجەکانو قانونەکانی نێوان هەردو دەوڵەتە. ئەگەر هەر کاتێ لای کاربەدەستانی دەوڵەتی خۆیان بەهانەیەکیان بەدەستەوە بێ، پیشانی بدەن بۆ ئەوەی ئێمەش هەوڵی چارەسەرکردنی بدەین، ئەگینا دەس لەم کارانە هەڵبگرنو، ناوچە داگیرکراوەکان بەجێ بهێڵنو بگەڕێنەوە. والی ناوبراو قسەی حسابیی قوبوڵ نەکرد، بەزۆریی لەشکرەکەی مەغرورو بەقسەی ئەوان وایان زانی بو لەزۆریی لەشکرەکەیان ئەترسم، دو مەنزڵی تر هاتنە پێشەوە تا گەیشتنە پێنجوێن لەوێ خێوەتیان هەڵدا. لەوە بێ ئاگابون کە من لەلێپرسینەوەی شەهریارو گلەیی داوەر سڵ ئەکەم نە لەترسی زۆریی ئەوان.

من بۆ دوربینیی هێواش هێواش مەنزڵێکم ئەکرد بەدوانو سێیان تا گەیشتینە لای قزڵجە بۆ ئەوەی دەستی دەستدرێژی بۆ سەر موڵکی پارێزراوی شاهانە کورت بکەینەوەو، شوێنە گیراوەکان بەجێ بهێڵنو

بگەڕێنەوە. کەڵکی نەبو بەهیچ جێیەک نەگەیشت. ئەو ڕۆژەی من گەیشتمە قزڵجە، ئەو شەوە والی هەزار کەس سواری بەسەرکردایەتی ئەمانوڵلاخان، کوڕەزای محەمەد ڕەشید بەگ، کە لەبنەماڵە گەورەکانی کوردستانە، بۆ دانانی مەحمود پاشا لەسلێمانی ناردبو، 7 سەد تفەنگچی بەسەرکردایەتی قوباد بەگی فەڕاشباشی لەڕێگەی شاخەوە نارد بۆ دەربەند، کە لەپشتی ئۆردوی منەوە بو بۆ ئەوەی ڕێگە لەمن بگرن. چونکە ئەوە ڕێگەی هاتوچۆی ئێمە بو، ئێمەشیان بەتاقمێکی کەم ئەزانی. خۆیشی لەگەڵ پێنچ شەش هەزار سوارەو تابورێک نیزام هاتە سەر ئۆردوەکەی من.. شەڕ بەناچاری ئێخەی گرتم. پشت بەخوا کەوتینە بەرەنگاری. لەنزیک ئۆردوەکەی ئێمەوە هەردولا لەیەکیان دا. پاش نیو سەعات سێ چارەک بەپێی ئایەتی: "کم من فئە قلیلە غلبت فئە کثیرە باذن الله" سەرەڕای کەمیی ئێمەو زۆریی ئەوان توانای بەرهەڵستییان نەماو مەیدانیان بەجێ هێشتو شکان. نزیکەی نیو سەعات دوایان کەوتینو گەڕاینەوە. ئەگەرچی مەیدانی شەڕەکە ئەرزی عیراق بو، بەڵام لەنیو سەعات زیاتر دوایان نەکەوتین نەوەکو لەسنور تێبپەڕین. لەپێش شەڕەکەشدا هەمو عەسکەرەکانمان تێ گەیاند بو کە بەهیچ جۆرێ لەسنور تێ نەپەڕن.

ئەو شەوە لەشوێنی شەڕەکەدا ماینەوە، بەیانی زو بۆ سەندنەوەی سلێمانی لەدەس ئەمانوڵلا خانو مەحمود پاشا ڕومان کردە سلێمانی. قوباد بەگ کەسەر ڕێگەی لەئێمە گرت بو، بەبیستنی شکانی والی هەڵاتو، مەحمود پاشاو ئەمانوڵلا خانیش کەچوبونە سەر سلێمانی، بەبیستنی گەڕانەوەی منو هەواڵی تێشکانی والی، شارو ئاواییەکانی نزیکیان تاڵان کردبو. چەند کەسێکیشیان بەناڕەوا کوشتوە. کەلوپەلی تاڵانکراویان بەوڵاخی ئاغایانو نۆکەرەکانیانو قەتارچییەکان گواستۆتەوە. بۆ سەندنەوەی ئەم تاڵانییە دوایان نەکەوتین چونکە ئەبو بچینە ناو سنوری ئەوانەوە. ئەوەش بێ فەرمانو ویستی ئاصەفانە نە ئەکرا. دەستمان لەهەمو ئەو کەلوپەلو ئێسترو ماینو ڕەوەو گەلەیە هەڵگرت. ناوچەکانی شارەزور کەداگیریان کردبو هەمویان تاڵان کردوە. چەند ژنو پیاویان کوشتوە. سێ سەد خێزانیان بۆ لای بانە ڕاگواستوە.

من کە گەیشتمەوە سلێمانی مەملەکەت وێرانو تاڵان کرابو. زەرەرو زیانێ کەئەم جارە بەهۆی ڕەزاقولی خانی والیی سنەوە بەسلێمانیو ناوچەکانی شارەزور گەیشتوە، لەحساب نایەت" (نصیری: 2/184-186).

# سەرچاوەکان


ئەنوەری سوڵتانی: "دەسنوسی کوردی (وفارسی سەبارەت بەکورد) لەکتێبخانـەکانی بـەریتانیا"، کتێبـی ئەرزان، (سوید1997).

ئیبـراهیم ئـەردەڵانی، محەمـەد: "مێـژوی ئـەردەڵان، ذەیلـی شـەرەفنامەی بەتلیسـی"، سـەرەتا نوسـین‌و ساغکردنەوەی: نەسرین برنا. وەرگێڕانی: ئەنوەری سوڵتانی، (سوید 1997).

بابانی، عبدالقادر ابن رستم: "تاریخ‌و جغرافیای کردستان، موسوم به: سیر الاکراد"، به اهتمـام "محمـد رئوف توکلی"، (تهران 1366 ه.ش).

خسرو بن محمد بن منوچهر اردلان: "لب التـواریخ"، وێنـەی دەسـخەت‌و وەرگێڕانـی روسـی، مۆسـکۆ 1984.

رونق، میرزا عبداله سنندجی: "تذکره حدیقەی امان اللهی"، بەتصحیح‌و تحشیه د. ع. خیامپور، موسسه تاریخ‌و فرهنگ ایران، (تبریز 1344 شمسی).

فخر الکتاب، میرزا شکراله سنندجی: "تحفەی ناصـری در تـاریخ‌و جغرافیـای کردسـتان"، بـه اهتمـام (دکتر حشمت الله طبیبی"، انتشارات امیر کبیر، (تهران 1366 ه. ش).

گلستانه، ابو الحسن بن محمد امـین: "مجمـل التـواریخ"، بسـعی‌و اهتمـام مـدرس رضـوی، انتشـارات دانشگاه تهران، چاپ سوم، (تهران 2536 شاهنشاهی).

مستوره، ماه شرف خانم: "تاریخ اردلان"، به اهتمام "ناصر ازادپور"، (سنندج 1343 ه.ش).

مەستورەی کوردستانی: "مێژوی ئەردەڵان"، وەرگێڕانی بۆ کوردی: د. حسن جـافـو شـکور مصـطفی، دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی، (بەغداد 1989).

مهدوی، عبدالرضا هوشنگ: "تاریخ روابط ایران از ابتدای دوران صفویه تا پایان جنـگ دوم جهـانی"، انتشارات امیر کبیر (تهران 1364 ش).

وقائع نگار کردستانی، علی اکبر،: "حدیقەی ناصری در جغرافیاو تاریخ کردستان"، بـه اهتمـام "محمـد رئوف توکلی"، (تهران 1364 ه. ش).

هدایت، رضاقلی خان: "فهرس التواریخ"، بەتصحیح و تحشیه: دکتـر عبدالحسـین نـوائی و میـر هاشـم محدث، پژوهشگاه علوم انسانی‌و مطالعات فرهنگی، (تهران 1373).

امین زکی، محمد: "تاریخ السلیمانیه وانحائها"، ترجمه: محمد جمیل بنـدی الرۆژبیـانی، شـرکه الطباعـه والنشر المحدوده، (بغداد 1951)

عماد عبدالسلام رووف: "المصل فی العهد العثمـانی - فتـره الحکـم المحلـی 1139-1249 ه 1726-1834 م"، (النجف 1975)

العزاوی، عباس: "تاریخ العراق بـین احتلالـین"، 8 جلـد، (بغـداد)، طبعـه ثانیـه، الشـریف الرضـی، (قـم 1410)

لونگریک، ستیفن همسلی: "اربعه قرون من تاریخ العراق الحدیث"، ترجمه: جعفر الخیاط، (بغداد 1968)

پورگشتال، هامر: "تاریخ امپراطوری عثمانی"، ترجمه: میرزا زکی علی ابادی، به اهتمام: جمشـید کیـان فر، 5 جلد، (تهران 1367-1369 ه ش)

نصیری، محمد رضـا: "اسـناد سیاسـی دوره قاجاریـه"، 4 جلـد، انتشـارات کیهـان، (تهـران 1366 - 1368 ه ش)

نوائی، دکتر عبدالحسین: "اسناد و مکاتبات سیاسی ایران از سال 1105 - 1135 هجری قمری"، موسسه مطالعات و تحقیقات فرهنگی، (تهران 1363 ه ش)

"کەشکۆڵی شیعرێکی کوردی (گۆرانی) گردەوەکۆیی شێخ عبدالمومنی مەردۆخی (1152 - 1211 / 1739 - 1797)، ساغ کردنەوە و سەرەتانوسینی: ئەنوەری سوڵتانی، (لەندەن 1998)

دیوانی نالی: لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم.

تاریخ خسرو بن محمد بنی اردلان، چاپ عکسی از روی نسخه خطی، ترجمه به روسی، مقدمه، تعلیقات و فهرستها از: ا. واسیلیوا، (مسکو 1984)

دیوان مستوره کردستانی، ویراسته دکتر صدیق صفی زاده (بورەکەئی)، انتشارات امیر بهادر، (تهران بهار 77)

مذکرات مامون بک بن بەگە بک، نقلها الی العربیه وعلق علیها: محمد جمیل الروژبیانی و شکور مصطفی، من مطبوعات المجمع العلمی العراقی - الهیئه الکردیه، (بغداد 1980)

Kurdish Independent Kingdoms and Autonomous Principalities circa 1835:

**BABAN** - Independent kingdom or principality and its approximate domain

*ARDALAN* - Autonomous vassal principalities and khanates

Rewandus - Capital

Arbil - A major populous city

—— - International boundaries

—— - Boundaries of autonomous principality

# بەشی سێ یەم

## حکومەتی کوردستان
## کورد لە گەمەی سۆڤێتیدا

**ڕێبەندانی** 1324– **سەرماوەزی** 1325

22 **ی جەنیوەری –** 17 **دێسەمبەری** 1946

## پێشەکی

حکومەتی کوردستان لە مەهاباد، دوای تەجروبەی حکومەتی کوردستانی جنوبی لە سلێمانی لە سەرەتای بیستەکاندا، دوەمین تەجروبەی حوکمڕانی کوردە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا. ئەم تەجروبەیە سەرەڕای کورتیی ماوەکەی یەکێکە لە کێلە بەرزە دیارەکانی سەر ڕێگای دورودرێژی خەباتی نەتەوەی کورد لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆییدا. هەر بۆیە نوسەرانی کورد و بێگانە بایەخێکی تایبەتییان پێ داوە.

لەسەر حکومەتی کوردستان لە مەهاباد و، ڕوداوەکانی پێش و پاش دامەزراندنی زۆر وتار، باس و بابەت، بە زمانی جیاجیا، لە لایەن کورد و ئێرانی و ئەوروپایی و ئەمریکاییەوە نوسراوە.

کەس نیە لەسەر مێژوی نوێی کوردی نوسی بێ، کەم و زۆر باسی مەهابادی نەکردبێ. گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان وەکو "خەبات - النضال"، "ئازادی"، "دەنگی کورد - صوت ألاکراد"، "ژین"، گۆڤارەکانی "ڕۆژی نوێ"، "ڕۆناهی" لە سالانی 1959 - 1960 دا گەلێ بابەت و وتاری بەنرخیان لە سەر بلاوکردۆتەوە. تا ئێستاش حیزبی دیموکراتی کوردستان سالانە یادی ئەم ڕوداوە مێژوییە ئەکاتەوە و لە سەری ئەنوسێ.

لەناو کوردا ئەوانەی بە کوردی لە سەریان نوسیوە:

عەلادین سوجادی، عەبدوڕەحمان زەبیحی (ع زانا)، مەحمود مەلا عیزت، جەلال تالەبانی، د عەبدوڕەحمان قاسملو، کەریمی حسامی، ڕەحیمی قازی، سەید محەمەدی سەمەدی، هێمن، ئەحمەد تۆفیق (أ ت سوارە)، بەکر عەبدولکەریم حەوێزی (ب ئەلوەند)، عەبدولقادر دەباغی.

ئەوانەی بە عەرەبی لە سەریان نوسیوە:

جەلال تالەبانی، عەبدوڕەحمان زەبیحی، د. سەید عەزیز شەمزینی، مەسعود بارزانی، کەریم زەندی، د عەبدوسەتار تاهیر شەریف.

ئەو ئێرانییانەی لە سەریان نوسیوە:

بە فارسی: نەجەفقولی پسیان، جەعفەر مەهدی نیا، مستەفا ئەلەموتی.

بەئینگلیزی: د روحوڵا رەمەزانی و حەسەن ئەرفەع.

بێگانە لەوانە:

بە ئینگلیزی ئارشی روزفێلت و ولیام ئیگلتن و ویلسن هاوێل.

بە فەرەنسی کریس کوچرا.

ئەوانەی نوسینە ئینگلیزییەکانیان وەرگێڕاوەتە سەر کوردی یا عەرەبی وەکو:

ناجی عەباس و زاهیر حەمەد، کە هەریەکەیان لە ماوەیەکی جیاوازدا، وتارەکەی ئارشی روزفیلت یان بە لێدوانەوە کردوّتە عەرەبی.

جەرجیس فەتحوڵا و سەید محەمەدی سەمەدی کتێبەکەی ئیگلتن یان بە لێدوانەوە یەکەمیان بۆ عـەرەبی و دوەمیان بۆ کوردی وەرگێڕاوە.

چەند کەسێکیش نامەی ئاکادیمییان لە سەر ئامادەکردوە لەوانە:

خانمی فەریدە کەمالی دیهکوردی بەزمانی ئینگلیزی نامەی ماستەر بۆ زانستگا ئۆکسفۆرد 1986 و، د گوڵمراد مرادی بە زمانی ئەڵمانی نامەی دکتۆرا بۆ زانستگای هایدلبیرگ 1991.

رەنگە هەبێ بڵێ جا ئەگەر ئەم هەمو شتەی لە سـەر نوسـرابێ چ پێویسـت ئـەکا شـتی تـری لـە سـەر بنوسرێ؟

بە لای منەوە، لێکۆڵینەوە لە سەر حکومەتی کوردستان هەمیشە بە ناتەواو دائەنرێ تـا ئـەو رۆژەی بـە کەرەستەی چەند سەرچاوەی تر دەوڵەمەند ئەکرێ وەکو:

دۆکۆمێنتەکانی ئێران و رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەی تاران

دۆکۆمێنتەکانی حکومەتی سۆڤێتی

دۆکۆمێنتەکانی حکومەتی ئەمریکی

دۆکۆمێنتەکانی حکومەتی کوردستان خۆی

بۆ ئامادەکردنی ئەم باسە هەوڵی کردنی دو شتم داوە: یـەکێکیان، زۆری ئـەو بابـەت و لێکۆڵینەوانـەم پشکنیوە کە بە زمانی جیاواز و لە سەردەمی جیاوازدا لەسەر حکومەتی کوردسـتان نوسـراون. ئـەوی تریـان، لەم باسەدا پشتم بە بەڵگەکانی حکومەتی کوردستان، لە پلەی یەکەم دا، بە رۆژنامـە و بڵاوکراوەکـانی ئەوکاتـە بەستوە. هەوڵم داوە خوێندەوار ببەمەوە ناو روداوەکانی ئەو زەمانە بۆ ئەوەی خۆی داوەری بکات.

بۆ ئەوەش زۆر جار هەندێ لە نوتقەکانی پێشەوا و بەرپرسانی تری حکومەت و وتـار و لێدوانـەکانی رۆژنامەی کوردستانم، بێ لێ قرتاندن وەکو خۆی نوسیوەتەوە. یـاخود روداوەکـانم بـە درێـژی وەکـو خـۆی گێڕاوەتەوە. رەنگە هەندێ کەس ئەمەیان پێ زیاد بێ، بۆ من ئەگەرچی ئەمە مانـدوبونێکی زۆرتـر بـو، بـەڵام وام بە پێویست و بە چاک زانی. دوەمین تەجروبەی حوکمڕانیی کورد ئەهێنێ پیاو بچێتە نـاو وردە بـاس و بابەت و روداوەکانیەوە.

بۆ تەواو کردنی ئەم کارە زۆر کەس یاریدەیان داوم:

دۆسـتانی بـەڕێز: ئەحمـەدی ئەسـکەندەری، عومـەری ئێلخـانی زادە، عەبـدولقادری دەبـاغی، د سـادقی شەرەفکەندی، سەلاح رەشید، مەحمودی مەلا عیزەت، حەسەنی قـازی، د لـەتیف رەشـید، محەمـەد قـەرەداخی... گەلێ سەرچاوەی نایابیان بۆ پەیدا کردم.

مامۆستایانی بەڕێز: ئیبراهیم ئەحمەد و سەلاحەدینی موهتەدی، پێشنوسی کتێبەکەیان خوێندەوە، گـەلێ تێبینی مێژویی و سیاسی و زمانەوانی بەنرخیان دەربڕی.

کاک بەکرئاغای حەویزی بە نامەیەکی تایبەتی وەڵامی پرسیارەکانی دامەوە.

برایانی بەڕێز: شازاد صائیب، کاکەمین قادر، ئازادی کاک مستەفا، بەختیار مستەفا، یاریدەی هونەرییان دام.

ئەگەر چاکەی ئەو جوامێرانە نەبوایە لەوانە بو ئەم بەرهەمە هەرگیز ڕوناکی نەبینێ. پڕبەدڵ سپاسیان ئەکەم.

بێگومان هەر بیرو بۆچون و داوەرییەک لەم کتێبەدا هاتوە، ڕاست بێ یا چەوت، ئۆباڵەکەی بە تەنیا لە ئەستۆی خۆم دایە.

هیوام وایە لە کارەکەم دا سەرکەوتو بم.

نەوشیروان مستەفا ئەمین
لەندەن، مایسی 1993

## نەخشەی -١-

## کوردستان لەباری سەرنجی مێژوونوسێکی کوردەوە

سەرچاوە: محمد امین زکی، کورد و کوردستان، بەغداد، ١٩٣٠

تێبینی: نووسەر ئەم پەراوێزەی لەسەر نەخشەکەی نوسیوە:

قەومی کورد ئەم وەضعییەتی قەومی کوردە، بە گوێرەی خەریتەی عەشائیری کورد (سیر مارک سایکس)، خەریتەی ئەتنوگرافیی (چوار عەصری ترایی عیراق، میجەر لونگریک)، خەریتەی لیجنەی عصبە الامم و، خەریتەیەکی سری کە لە ساڵی ١٩١٢دا لو ٢٦ئاغستوس دا بۆ ضابطانی ئوردوی هند طبع کرابو و، لە سەر مەعلوماتی ئینسیکلوپیدیای ئیسلام و، (کریلر، مهاجرین مدیر عمومیە)

نەخشەی -٢-

**کوردستان لەباری سەرنجی ئەفسەرێکی ئێرانییەوە**

**سەرچاوە: حسن ارفع، کوردەکان (بە ئینگلیزی)، لەندەن ١٩٦٦**

## نەخشەی -٣-

کوردستان لەباری سەرنجی دیپلوماتێکی ئەمریکاییەوە

سەرچاوە: ولیام ئیگلتن، کۆماری کوردی ١٩٤٦ (بە ئینگلیزی)، لەندەن، ١٩٦٣

**نەخشەی -٤-**

**میرایەتییەکانی کورد تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە**

**سەرچاوە: امیر حسنپور، نەتەوایەتی و زمان لە کوردستاندا (بە ئینگلیزی)،**

**سانفرانسیسکۆ، ١٩٢٢**

# 1. ئێران له سایەی دەسەلاتی پەهلەویدا

## 1. ئێران و دنیا

رەزاشا بۆ ئەوەی بیپەرژێتە سەر بەهێزکردنی دەسەلاتی خۆی لە ناوەوەی ئێراندا زۆری مەبەست بو پەیوەندیەکانی ئێران لەگەڵ دەوڵەتانی دنیا، بەتایبەتی لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێی، باش بکا.

### 1. 1. ئێران و دراوسێکانی

حکومەتی رەزاشا تا ساڵی 1929 ئامادە نەبو بە رەسمی دان بە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقدا بنێ. حکومەتی عێراقی پشت گوێ خست بو. هەر شتێکی پێوەندی لەگەڵ کاروباری عێراق هەبوایە راستەوخۆ لە گەڵ کاربەدەستانی بەریتانیا باسی ئەکرد. ساڵی 1929 ئێران بەرەسمی دانی بە دەوڵەتی عێراقدا نا. هەردو دەوڵەت رێککەوتنێکی کاتی‌یان ئیمزا و ئاڵوگۆری دیپلۆماسی‌یان کرد. هەر لەو ساوە چەندین ناکۆکی ئەرزی و ئابوری لە نێوان ئەم دو دەوڵەتەدا هەبو. هەندێ لەم ناکۆکی‌یانە لەسەردەمی عوسمانی‌یەوە بەمیرات بۆ دەوڵەتی تازە- دامەزراوی عێراق بەجێ مابو.

لە ساڵەکانی دو جەنگی جیهانیدا سەرانسەری رۆژهەلاتی ناوەراست لە ژێر دەسەلات، یاخود نفوزی ئینگلیزدا بو. بیری بەستنی پەیمانێکی دیفاعی لە نێوان دەوڵەتانی رۆژهەلاتی ناوەراستدا بۆ رێبرین لە تەنینەوەی نفوزی روسی بەرەو خەلیج و پاراستنی پەترۆڵجارەکانی ناوچەکە لای کاربەدەستانی ئینگلیز گەلالە بو. بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵی ئەدا دەوڵەتانی ناوچەکە لە یەک نزیک بخاتەوە، ناکۆکی‌یەکانیان بەخۆشی چارەسەر بکات، پێوەندی دۆستانەیان لە نێواندا دروست بکات بۆ ئەوەی زەمینەی بەستنی پەیمانێکی وەها خۆش بکات.(1)

ساڵی 1932 مەلیک فەیسەل، شای عێراق، سەردانێکی رەسمی ئێرانی کرد. ئێرانی‌یەکان بۆ کۆبونەوەکانی ئەم سەردانە 3 کێشەیان خستبوە بەرنامەی گفتوگۆکانەوە:

1. کێشەی جیاکردنەوەی سنوری شەتولعەرەب.
2. هاوکاری لە کاروباری نەوتدا.
3. دانانی سیاسەتێکی هاوبەش بەرامبەر کورد.(2)

ئەم سەردانە پێوەندی دوقۆڵی هەردو وڵاتی بۆ پێشەوە برد.

شەتولعەرەب وەکو کێشەیەکی زیندو لە پێوەندییەکانی هەردولادا مایەوە تا لە ساڵی 1937 دا "ڕێککەوتنی سنوری لە نێوان عێراق و ئێراندا" ئیمزا کرا. بە دوای ئەم ڕێککەوتنەدا "پەیمانی دۆستایەتی" یشیان بەست. بەگوێرەی ئەم پەیمانە هەردولا پێکهاتن لەسەر دانانی ڕێوشوێنی چەند ڕێککەتنێکی تر دەربارەی، دراوسێیەتی باش و ئاسایشی سنور، گێڕاندنەوەی تاوانکاران، ئیقامە و جنسیە، کاروباری بازرگانی، هاوکاری دادوەری، پێکهاتنی کۆنسوڵی، پۆست و تەلگراف.(3)

لە سەرەتای دامەزراندنی جمهوریەتی تورکیاوە ڕەزاشا هەوڵی دا پێوەندی دۆستانە لەگەڵ مستەفا کەمال دروست بکا. هەر ئەوسا قورئانێک و شمشێرێکی بە دیاری بۆ ناردبو.

لە ساڵی 1926 دا "موعاهەدەنامەی ویدادیە و تەئمینیە" یان بەست. هەرچەندە هەڵگیرسانی شۆڕش لە کوردستانی تورکیا و تێکچونی ئاسایشی سنور و گومانی کاربەدەستانی تورک لە تێوەگلانی ئێران ماوەیەک نێوانی تێک دان، بەڵام زۆری نەخایان نێوانیان خۆش و پێوەندییەکانیان گەرم بوەوە.

لە 1930 دا ڕێککەوتنێکی گومرگییان ئیمزاکرد.

لە 1932 دا ڕێککەوتنی سنورییان مۆر کرد. بە پێی ئەم ڕێککەوتنە ئێران بەشێ لە بنارەکانی چیای ئاراراتی دا بە تورکیا بەرامبەر پارچە ئەرزێکی فراوان لە ورمێ.

لە 1932 دا ڕێککەوتنی دۆستایەتی و بێتەرەفی و هاوکاری ئابوری نێوان دو وڵات لە ئەنقەرە ئیمزا کرا.

ساڵی 1934 ڕەزاشا لە سەر بانگهێشتی مستەفا کەمال سەردانێکی ڕەسمیی تورکیای کرد. لەم سەردانەدا هەردو پێشەوا لەسەر سیاسەتی دەرەوە پێک هاتن.

ڕەزاشا پتەوکردنی پێوەندی لەگەڵ تورکیا ئەوەندە بەلاوە گرنگ بو، لە کاتی بێنەوبەرەی نوێنەرانی ئێرانی و تورکی لەسەر دابەشکردنی مەڵبەندەکانی سنوری هەردو دەوڵەت، هەردولا لە سەر خاوەنێتی چەند بەرزاییەک کێشەیان بو، ڕەزاشا بە نوێنەرەکانی خۆی گوت بو: "دۆستایەتی ئێران و تورکیا بنچینەیە ئەم گردە بەشێ بێ لەخاکی ئێران یا لەخاکی تورکیا گرنگ نیە، بیدەن بە وان."(4)

پاش ئەوەی ئەفغانستان لە 1921دا سەربەخۆیی تەواوی لە بەریتانیا وەرگرت ئێران بە ڕەسمیی دەوڵەتی ئەفغانستانی ناسی و هەر لە هەمان ساڵدا "عەهدنامەی مودەدەت و بێتەرەفی ئێران و ئەفغانستان" لە کابول ئیمزا کرا. ئەمانوڵاخان و هاوسەرەکەی ساڵی 1928 دوای گەشتی ئەوروپا سەردانی تورکیا و ئێرانیشی کرد. ئەمانوڵاخان ویستی لاسایی ئێران و تورکیا بکاتەوە لە چاولێکەری ئەوروپادا بەڵام ئێلە کۆنەپارێزەکانی لێ ڕاست بونەوە شۆڕشیان کرد. ئەمانوڵاخان شکا. سەردار محەمەد نادرخان، وەزیری موختاری ئەفغانستان لە پاریس، کاروباری گرتە دەست و شۆڕشگێڕەکانی شکاند. ئێران حکومەتی نوێی بەڕەسمی ناسی. لە 1930دا ئاستی ئاڵوگۆڕی دیپلۆماسی لە ئاستی کۆنسوڵییەوە بەرزکردەوە لە کابول سەفارەتی دامەزراند.

لە 1934 دا لە ئەنجامی ناوبژی و "تەحکیمی" تورکیادا ناکۆکیە ئەرزییەکانی ئێران و ئەفغانستان لە خوراسان و سیستان لابەلا کرا.(5)

ئێران نێوانی لەگەڵ دراوسێکانی باش بوبو. زەمینەی بەستنی پەیمانێکی هاوبەش خۆش بوبو. ئینگلیزیش ڕەنجێکی زۆری دا بو ئەم دەوڵەتانە لە یەک نزیک بخاتەوە و لە چوارچێوەی پەیمانێکی "ئیقلیمی" دا دژی مەترسی یەکێتی سۆڤێت یەکیان بخا.

